پەیامی تەوحیدم بۆتان ئامادە کردووە ئەی قەومەکەم

# تەوحید
# قەومەکەم تەوحید

نوسین و کۆکردنەوەی

[عبدالإله عبدالعدل]

بەناوی أللّٰه

[پەیامی تەوحیدم بۆتان ئامادە کردووە ئەی قەومەکەم]

[عبدالإله عبدالعدل]

ئەی قەومەکەم، هاوزمانەکانم، پەیامێکم پێیە، ئەویش پەیامی تەوحیدە، هەموو شتێکم لەبارەیەوە باس کردووە بەشێوازێکی پوخت و بە دەلیلەوە، ئەمەی باسم کردووە ئەتوانم بڵێم ناوەڕۆکی تەوحیدە و هەر چ کەسێک بیزانێت و دانی پێدابنێ ئەوا ئەهلی تەوحیدە و پایەدارە إن شاء الله سبحانە. ئەم بابەتە لە (١٠) بەش پێکهاتووە و هەموو بەشەکانیش بە پوختی لێرەدا بەیەکەوە باس ئەکەم چونکە گرێدراوی یەکترن، تۆش ئەتوانی کاتی تایبەت تەرخان بکەیت و بە هێمنیی بیخوێنیتەوە و سودمەندی بیت . بەشەکانیش ئەمانەن :-

بەشی یەکەم: مانای (توحید) لەڕووی زمانەوانیی و لەڕووی شەرعیی

بەشی دووەم: بۆچی تەوحید بابەتێکی هێندە گرینگە بەلامانەوە ؟؟!

بەشی سێیەم: دوو مەرجەکەی تەوحید و بەڵگەکانیان

بەشی چوارەم: مانای (طاغوت) لە ڕووی زمانەوانیی و لە ڕووی شەرعیی

بەشی پێنجەم: جۆرەکانی طاغوت کە أللە لە قورئان باسی کردوون

بەشی شەشەم: چۆنیەتی کوفرکردن بە طاغوت

بەشی حەوتەم: باوەڕهێنان و تەوحید کردنی أللە لە ڕووی (ربوبیة)

بەشی هەشتەم: باوەڕهێنان و تەوحید کردنی أللە لە ڕووی (ألوهیة)

بەشی نۆیەم: سێ مەرجەکەی پەرستنی أللە. (حب و خوف و رجاء)

بەشی دەیەم: باوەڕهێنان و تەوحید کردنی أللە لە ڕووی (أسماء والصفات).

# بەشی یەکەم

ماناى (توحيد) لەڕووی زمانەوانیی و لەڕووی شەڕعیی :
وشەی (التوحيد) لەڕووی زمانەوانییەوە واتە: بەتەنها دانان و بە عەرەبیی واتە: جعل .جیاکردنەوەی شتێک لەناو کۆمەڵێک شت المتعدد واحداً.بۆ نموونە ئەگەر بڵێی «کەس لە ماڵ نییە تەنها أحمد نەبێت». جا هەروەک بەدی دەکرێت، لە نموونەکەدا ڕستەکە بەسەر دوو بەش دابەش دەکرێت:
بەشی یەکەم: بریتییە لە پارچەی «کەس لە ماڵ نییە»، لەم پارچەیەدا ئەوەمان ڕاگەیاندووە کە هیچ کەسێک لە ماڵەکە نییە. کەواتە هیچمان تێیدا نەهێشتەوە، ئەمەش پێی دەگووترێ (نفي).
بەشی دووەم: بریتییە لە پارچەی «تەنها أحمد نەبێت»، لەپاش ئەوەی سەرەتا هیچمان لە ماڵەکە نەهێشتەوە، لەم پارچەیەدا ئەمەش پێی دەگووترێ (إثبات). تەنها یەک کەسمان لە ماڵەکە چەسپاند و دیاریکرد، ئەویش بریتیە لە أحمد لەمەوە دەگەینە ئەنجامێک: ئەویش ئەوەیە کە (التوحيد) لەڕووی زمانەوانییەوە دوو مەرجی هەیە: (نفي) و (إثبات) ئەگەر ئەم دوو مەرجە پێکەوە هاتنەدی، ئەوا (التوحيد) ـەکە تەواوە. لە بەشی سێیەمدا دەگەینە باسی دوو مەرجەکەی تەوحید لەڕووی شەڕعییەوە وشەی (التوحيد) لەڕووی شەڕعییەوە واتە: یەکتاکردن و تەوحید کردنی ألله لە سێ ڕووەوە:

لەڕووی پەروەردگارێتی (ربوبية)، و لەڕووی پەرستراوێتی (الألوهية)، و لەڕووی ناو و سیفاتەکانی (الأسماء والصفات). لە بەشی هەشتەم و نۆیەم و دەهەمدا هەر سێکیان باس ئەکرێن.ئەوەی لەم بەشەدا مەبەستم بوو، تەنها ئەوەیە کە تۆ بزانیت ماناى تەوحید چییە لە ڕووی زمانەوانیی و شەڕعیی ، لەبەشی دووەمەوە ئەچینە ناو وردەکارییەکان.

## بەشی دووەم

بۆچی تەوحید بابەتێکی هێندە گرینگە بەلامانەوە ؟؟!

ئەهلی تەوحید جیاوازن لە تێکڕای ئەو جەماعەتانەی کە بانگەوازی ئیسلام دەکەن؛ چونکە هیچیان حەقیقەتی تەوحیدبەخەڵکی ناگەیەنن هێندەی ئێمە، الحمدلله حەقیقەتی تەوحید لای ئێمەیە و ئەمەشمان دەیان و سەدان جار سەلماندووە، هەموو کاتێکیش ئامانجی یەکەممان بریتی بووە لە گەیاندنی تەوحید. نەک هەڵخەڵەتاندنی خەڵک بە کۆمەڵێک شتی لابەلا. جا حەتمەن ئەوە پرسیارێکی زۆر زۆر گرینگە ؛ چونکە هەر کاتێک سوودی شتێک بزانرێت ئیتر دەردەکەوێت چەندە گرینگە. جا لێرەدا زۆر گرینگە باسی پلەوپایەی تەوحید بکەم؛ تاکو تۆی زانستخواز بزانیت بۆچی ئێمە هێندە جەخت لە تەوحید ئەکەینەوە :

١- یەکێک لە نیشانەکانی گرینگیەتی تەوحید ئەوەیە کە بانگەوازی تێکڕای پێغەمبەران بووە -عليهم الصلاة والسلام-، واتە ئەگەر سەد هەزار پێغەمبەر هەبووبن ئەوا هەر هەموویان ئەم پەیامی تەوحیدەیان بە ئوممەتەکانیان گەیاندووە بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله: {وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ...} النحل: ٣٦ .

واتە: {بێگومان ئێمە نێردراومان بۆ هەموو ئوممەتێک ناردووە تا ئاگاداریان بکاتەوە لەوەی ألله بپەرستن و دوورکەونەوە لە تاغوت}.

٢- تەوحید هۆکاری سڕانەوەی تێکڕای تاوانە گەورە و بچووکەکانە، هەر کەسێک بزانێت تەوحید چییە و پاشانیش باوەڕی پێ بهێنێ ئەوا بەسیەتی بۆ ئەوەی ألله لە کەمتەرخەمیی و تاوانەکانی ببوورێت بەو مەرجەی تاوانەکانی بە حەلال نەزانیبێ. بەڵگەش بریتییە لە فەرموودەی قودسی:

يا ابن آدم إنك لو أتيتني بقراب الأرض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا لأتيتك بقرابها مغفرة. واتە: ئەی ڕۆڵەی ئادەم، بەڕاستیی ئەگەر بگەڕێیتەوە لام و بەقەد پڕاوپڕی زەوی هەڵەت هەبێت، پاشان کە پێم گەیشتیت هیچ شتێکت نەکردبێتە هاوەڵم ئەوا بێگومان منیش بەقەد پڕاوپڕی زەوی لێبووردنم بۆت دەبێت[سەرچاوە: سنن الترمذي].

٣- تەوحید تاکە هۆکارێکە بۆ ئەوەی موسوڵمان عیبادەتەکانی لێ قەبوڵ بکرێت لای أللە، هەر کەسێک تەوحیدی تێدا نەبێت و هەوڵ نەدات بۆ زانینی تەوحید ئەوا موشریکە، حەتمەن شیرکیش هەر ئەوە نییە کە سوجدە بۆ مرۆڤێک ببرێت، شیرکیش جۆری زۆرە و زانایان باسیان کردووە، بۆیەش هیچ کەسێک لە شیرکەکان پارێزراو نابێت ئەگەر نەزانێ تەوحید چییە بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی أللە: ﴿...وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ الأنعام: ٨٨ . واتە: {ئەگەر هاوەڵیان بۆ أللە بڕیار بدایە ئەوا سەرجەم کردەوەکانیان هەڵدەوەشایەوە}.

٤- هەر هەموو ئایاتەکانی قورئان پەیوەندیان بە تەوحیدەوە هەیە !! شێخ إبن القيم -رحمه الله- فەرموویەتی: بەڕاستی هەموو ئایەتەکانی قورئان کەوتوونەتە ژێر سێبەری تەوحید و شایەتن لەسەر تەوحید و بانگەوازی بۆ دەکەن. بۆ نموونە: بێگومان ئایاتەکانی قورئان بەشێکیان هەواڵن لەبارەی أللە و ناو و سیفاتەکانی و کردەوەکانی، ئەم ئایاتانە باس لە تەوحید دەکەن بەشێوازی هەواڵ و زانست. بەشێکی تریش لە ئایاتەکان بانگەوازن بۆ ئەوەی أللە بەتەنها بپەرسترێ و هاوەڵی بۆ دانەنرێت، ئەم ئایاتانەش بریتین لە داواکردنی أللە بۆ تەوحید. بەشێکی تریش لە ئایاتەکان بریتین لە فەرمان و قەدەغەکردن، کە ئەم ئایاتانەش بریتین لە حەق و ماف و تەواوکەرەکانی تەوحید. بەشێکی تریش لە ئایاتەکان باس لە ڕێزگرتنی أللە دەکات بۆ ئەهلی تەوحید کە چۆن پاداشتیان لە دونیا و

قیامەت دەداتەوە، ئەم ئایاتانەش بریتین لە پاداشتی تەوحید. بەشێکی تریش لە ئایاتەکان بریتین لە باسی سزادانی موشریکەکان لە دونیا و قیامەت، کە ئەم ئایاتانەش بریتین لە حوکمی لادان لە تەوحید. [سەرچاوە: پەڕتووکی مدارج السالکین ].
ئەی خوێنەری بەڕێز، ئەمانە بەشێکن لە سوود و پلەوپایەی تەوحید. بزانە کە هیچ هیچ بابەتێکی تر لە ئیسلامدا نییە کە هێندەی تەوحید بەسوود بێت، بۆیەش بەردەوامبە لەگەڵم بۆ ناسینی حەقیقەتی تەوحید.

## بەشی سێیەم

دوو مەرجەکەی تەوحید و بەڵگەکانیان:
لە بەشی یەکەمدا زانیمان کەوا تەوحید لەڕووی زمانەوانییەوە دروست نابێت ئەگەر (نفي) و (إثبات)ـی تێدا نەبێت، ئێستاش با بزانین لەڕووی شەرعییەوە ئاخۆ دەبێ چ شتێک (نفي) بکەین و چیش (إثبات) بکەین تاکو تەوحید مسۆگەر بکەین لەخۆمان. فەرموون...ألله لە قورئاندا لەدوای ئایەتی کورسی دەفەرمووێ: ﴿...فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ...﴾ البقرة: ٢٥٦. واتە: {جا هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و باوەڕبهێنێ بە ألله ئەوا بەدڵنیاییەوە دەستی گرتووە بە شتێکی پتەو}.
* تێبینی: زانایان لە تەفسیری وشەی (العروة الوثقى) دەڵێن بریتییە لە لا إله إلا الله کەواتە لەم ئایەتەدا ألله دوو مەرجەکەی تەوحیدی باس کردووە، کە ئەوانیش:
مەرجی یەکەم: کوفر کردن بە تاغوتەکان، کە ئەمەش یەکسانە

به بڕگەی (لا إله).

مەرجی دووەم: بـاوەڕ هـێنان بە أللە، کـە ئەمەش یەکـسانە بە بڕگـەی (إلا الله). کەواتە ڕستەی تەوحید پێویستی بەم دوو مەرجەیە، ئەمڕۆ زۆرێک خەڵک دەبینین مەرجی دووەمیان تێدایە، واتە نوێژ بۆ أللە دەکەن و هەر لە ئەو دەپاڕێنەوە و زۆر شتی تریش، بەڵام هیچ ئاگاداری مەرجی یەکەم نین. بۆیەش ئەم کەسانە موسوڵمان نین؛ چونکە هیچ ئاگادری بە درێژیی حەقیقەتی تەوحید و مەرجەکانی نین. لە بەشەکانی داهاتوودا ئەچینە سەر باسی ئەم دوو مەرجە. لەم بەشەدا تەنها ئامانجم ئەوە بوو کە بزانیت تەوحید دوو مەرجی هەیە و موسوڵمانیش ئەو کەسەیە کە هەردوو مەرجەکەی تێدابێت بەیەکەوە.

## بەشی چوارەم

مانای (طاغوت) لەڕووی زمانەوانیی و لەڕووی شەڕعیی :-

لە بەشی پێشوودا گووتمان تەوحید دوو مەرجی هەیە، ئیتر لەم بەشە و دوو بەشی داهاتووشدا دێینە سەر شیکردنەوەی مەرجی یەکەم، ئەویش (کوفرکردنە بە طاغوتەکان). حەتمەن پێویستە سەرەتا بزانین طاغوت مانای چییە، هەروەها طاغوت چ شتێک ئەگرێتەوە، ئەوکات ئەتوانین کوفری پێ بکەین! بەڵام کەسێک کە هیچ لەسەر طاغوت نەزانێت ئەوا چۆن کوفری پێ بکات؟ وشەی (طاغوت) لەڕووی زمانەوانییەوە لەسەر کێشی (فعلوت) ـە، ئەمەش کێشێکە کە تایبەتە بە زیادەڕەویی زمانەوانییەوە بە مانای (واتە مبالغة). وشەی طاغوت لەڕووی (سنووربەزاندن) دێت. أللە لە کتێبەکەیدا دەفەرمووێ: ﴿...لما طغا الماء...﴾، واتە: {ئەو کاتەی کە ئاوەکە سنووری بەزاند و زۆربوو...}.

وشەی (طاغوت) لە ڕووی شەرعەوە چەندین پێناسەی هەیە کە
هەموویان لەژێر پێناسەکەی شێخ إبن القیم -رحمه الله- کۆدەبنەوە،
ئەویش ئەوەیە کە فەرمووی: "والطاغوت کل ما تجاوز به العبد حده من
معبود أو متبوع أو مطاع". واتە: "طاغوت هەر شتێکە کە مرۆڤ
سنووری تێدا ببەزێنێ، جا لەڕووی پەرستنەوە بێت، یان شوێنکەوتن و
پەڕتووکی إعلام چاولێکردن، یانیش گوێڕایەڵی کردن". (سەرچاوە
الموقعین).

## بەشی پێنجەم

جۆرەکانی طاغوت کە ألله لە قورئان باسی کردوون:
لەدوای ئەوەی لە بەشی پێشتردا زانیمان مانای وشەی طاغوت چییە،
ئێستەش با بزانین ألله لە کتێبەکەیدا چ شتێک بە طاغوت دەزانێت، ألله
لە قورئاندا باسی کۆمەڵێک شتمان بۆ ئەکات کە طاغوتن و ئەبێ
موسوڵمان بیانناسێت و کوفریان پێ بکات، کە ئەمانەن:
١- شەیتان: شەیتان سەرۆکی هەموو طاغوتەکانە، مەبەستیش لە
(شەیتان) تەنها ئیبلیس ناگرێتەوە، بەڵکو ألله لە (سوڕەتی الأنعام ئایەتی
١١٢) پێمان ئەڵێت شەیتانی مرۆڤ و جنۆکە بوونیان هەیە. بەڵگەش لەسەر
طاغوت بوونی شەیتانەکان ئەوەیە کە ألله فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ
يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ يس: ٦٠. واتە: {مەگەر
پەیمانم لێتان وەرنەگرت ئەی نەوەکانی ئادەم کەوا شەیتان نەپەرستن؟
بەڕاستی ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە}.
٢- هەر کەسێک کە بانگەوازی زانستی غەیب بکات: حەتمەن هەر کەسێک
ئەگەر بڵێت من ئەزانم لە داهاتوودا چی دەبێت، یاخود بە خەڵک بڵێت

ئەگەر ئاوابکەن ئەوا ئەم شتە ڕوودەدات و ئەگەریش ئاوابکەن ئەوا ئەم شتە ڕوودەدات ، ئەوا ئەو کەسە طاغوتە و بانگەشەی غەیبی کردووە. گومان لەوە نییە کە تەنها ألله ئاگاداری غەیبە، هەروەک فەرموویەتی: ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا﴾ الجن :٢٦.واتە: {ألله زانای غەیبە و کەسیش ناتوانێ پەردە لەسەر غەیبیاتەکانی لابەرێت}.
ئەتوانین بڵێین (ساحیر) و (فاڵچی) و بریتین لە دوو نموونە لەسەر ئەم تاغوتە؛ چونکە هەموویان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە گوایە شتانێک ئەزانن کە هێشتا ڕووینەداوە. هەروەها بە یەقین و دڵنیاییەوە باسی ئەکەن. (لە بەشی حەوتەم باسی چۆنیەتی کوفر کردن بە طاغوت ئەکەم. هەر کەسێک باوەڕی وابێت کەوا ئەم طاغوتانە قسەکانیان ڕاستە ئەوا ئەویش وەکو ئەوان کافرە، هەرکەسێکیش باوەڕیان پێنەکات کەچی سەردانیان بکات و گوێیان لێ بگرێت ئەوا تا ٤٠ ڕۆژ نوێژی لێ قەبوڵ ناکرێت. بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی پێغەمبەر کاتێک فەرمووی: ((من أتى كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل على محمد)).واتە: (هەر چ کەسێک سەردانی کاهینێک بکات و قسەکانی بە ڕاست دابنێت ئەوا کافر بووە بەو کتێبەی کەوا لەسەر محمد دابەزیوە). تێبینی: کاهین ئەو کەسەیە کە باسی داهاتوو ئەکات و ئەڵێت لە داهاتوودا فڵانە شت ڕووئەدات.
٣- هەر شەریعەتێک لە غەیری شەریعەتی ئیسلام: یەکێکی تر لەو جۆرانەی طاغوت کە ألله لە قوڕئاندا باسی کردوون، بریتییە لە تاغوتی شەریعەت، واتە هەر شەریعەتێک لە غەیری شەریعەتی ئیسلام، ألله فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ﴾ النساء: ٦٠. واتە: ((ئەی محمد، مەگەر ئەو کەسانەت نەبینیوە کە

بانگەشە ئەکەن گوایە باوەڕیان بەو کتێبە هەیە کە بۆتۆ دابەزیوە و هەروەها گوایە باوەڕیان بەو کتێبانەی پێشتریش، کەچی لە هەمان کاتدا ئەیانەوێت حوکم بگەڕێننەوە بۆ لای تاغوت لەکاتێکدا فەرمانیان پێکراوە تا کوفری پێ بکەن)). لەم ئایەتەدا أللە کوفری ئەو کەسانەمان بۆ ئاشکرا ئەکات کە خۆیان وا پیشان دەدەن گوایە موسوڵمانن، کەچی دەیانەوێت حوکم بگەڕێننەوە بۆ لای شەریعەتێکی طاغوت لە غەیری شەریعەتی ئیسلام. نموونەی شەریعەتە طاغوتییەکان زۆرن، وەکو (دیموکڕاسیەت) و (ئیشتیراکیەت) و (عەلمانیەت) و (شیوعیەت) و هی تریش، هەریەک لەم شەریعەتانە خاوەنی کۆمەڵێک بنچینە و بنەمان کە زۆر جیاوازە لەگەڵ بنچینەکانی ئیسلام. هەر کەسێک باوەڕی بە یەکێک لەم شەریعەتە طاغوتانە هەبێت ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم شەخصە کوفری بە طاغوت نەکردووە، هەروەها دەلیلە لەسەر ئەوەی ئەم شەخصە درۆ ئەکات ئەگەر گووتبێتی (من موسوڵمانم)! لەڕاستیدا ئەو کەسە ئەهلی طاغوتە نەک ئەهلی تەوحید.

٤- هەر (دەسەڵاتدار) و (دادوەر)ێک ئەگەر بە شەریعەتێکی طاغوت حوکم بدەن: ئەم دوو کەسەش ئەبن بە طاغوت، بۆ نموونە دەسەڵاتدارێک بڕیار ئەدات بەوەی شەریعەتێکی طاغوت بکرێت بە حاکم بۆ بەڕێوەبردنی وڵات و خەڵکەکە، یاخود هەر دادوەرێک ئەگەر کێشەیەک بهێنرێتە لای و ئەویش بە شەریعەت و یاسایە طاغوتییەکان کێشەکە چارەسەر بکات لەبری شەریعەتی ئیسلام. ئەوا لەو حاڵەتەدا جگە لەوەی کە شەریعەتەکە طاغوتە، لەهەمان کاتیشدا حاکم و دەسەڵاتدارەکەش ئەبن بە طاغوت. بەڵگەش بریتییە لە هەمان ئایەتی خاڵی سێیەم، دووبارە هەمان ئایەت ئەکرێتەوە دەلیل. لەگەڵ ئایەتێکی تریش کە أللە فەرموویەتی ﴿وَمَن لَّمۡ یَحۡكُم بِمَاۤ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰۤىِٕكَ هُمُ ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾ المائدة :٤٤.

واتە: {هەر کەسێک حوکم بەوە نەکات کە ألله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسانە کافرن}.هۆکاری کافر بوونەکە لەبەر ئەوەیە کە ئەم شەخصە بە شەریعەتێکی طاغوت (وەکو دیموکڕاسیەت) حوکم ئەدات و حوکمڕانیی ئەکات. کەواتە ئەو کەسە تەوحیدی تێدا نییە و کوفری بە طاغوت نەکردووە.

٥- هەر کەسێک بانگەشەی پەرستن بۆ خۆی بکات: حەتمەن ئەمەش جۆرێکی تری طاغوتە کە ألله لە قورئان باسی ئەکات هەر کەسێک خەڵک هان بدات بۆ ئەوەی بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە ئەوا ئەو کەسە تەنها کافر نییە، بەڵکو طاغوتیشە، پۆلی طاغوتەکەشی بریتییە لە (معبود).بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله: ﴿وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾الأنبياء :٢٩.واتە: { جا هەر کەسێک لەوان بڵێت من شایەنی پەرستنم لە غەیری ألله ئەوا ئێمەش بە دۆزەخ پاداشتی دەدەینەوە، ئاوا پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە }.

حەتمەن ئەگەر کەسێک بپەرسترێت لەکاتێکدا بەخۆی ڕازی نییە ئەوا پێی ناگووترێ طاغوت. بۆ نموونە پێغەمبەر (عیسا) و (عوزێر) علیهم السلام، یان شێخ عبدالقادری گەیلانی، ئەمانە کەسانێکی موەحید بوونە و بانگەوازی تەوحیدیان کردووە، بەڵام موشریکەکان ئەیانپەرستن، ئەمانە طاغوت نین . * ئەم پێنج خاڵەی باسم کرد، بریتین لە جۆرەکانی طاغوت کەوا ألله لە قورئاندا باسی کردوون، هەر کەسێک یەکێک لەم خاڵانەی لەسەر جێبەجێ ببێت ئەوا هەرگیز موەحید نییە و موسوڵمان نییە، ئەگەرچی بشڵێت (من موسوڵمانم) هەروەها نوێژ و شەونوێژیش بکات، هیچی لێ قەبوڵ ناکرێت؛ چونکە تەوحیدی تێدا نییە و ئەهلی طاغوتە.

## بەشی شەشەم

چۆنیەتی کوفر کردن بە طاغوت:

لە بەشی چوارەم و پێنجەمدا زانیت طاغوت مانای چییە، هەروەها زانیت جۆرەکانی طاغوت چین کە ألله لە کتێبەکەی باسی کردوون، ئێستا تۆ بەتەواویی ئەزانیت طاغوت چییە، بۆیەش کاتی ئەوەیە بزانیت چۆن کوفر بە طاغوت دەکرێت، سەرەتا با دووبارە بزانین بەڵگە چییە لەسەر واجبێتی کوفرکردن بە طاغوت ، ألله فەرموویەتی: ﴿...فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ...﴾ البقرة: ٢٥٦.واتە: {جا هەر کەسێک کوفر بکات بە تاغوت و باوەڕ بهێنێت بە ألله ئەوا بەدڵنیاییەوە دەستی گرتووە بە هۆکارێکی پتەو}. ئەم ئایەتەش بەڵگەیەکی ڕۆشنە لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە خۆیان لە تەکفیر دەدزنەوە و دەڵێن ئێمە لەسەرمان واجب نەکراوە تەکفیری طاغوتەکان و ئەهلی کوفر بکەین مادام دەڵێن موسلمانین!. بەڵێ ڕاستە ئەوان بە دەم ئەڵێن موسوڵمانین، بەڵام لە ڕووکەشدا ئێمە دەیانبینین کەوا کوفریان بە طاغوت نەکردووە و تەوحیدیان نییە! بۆیەش کافرن و موسوڵمان نین ئەگەر نوێژ و ڕۆژووش بگرن.ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کەسێک بیەوێت ئایەتەکەی ألله جێبەجێ بکات و کوفر بە طاغوتەکان بکات ئەوا دەبێ ئەم سێ هەنگاوە پەیڕەو بکات:

هەنگاوی یەکەم: تەکفیرکردنی طاغوتەکە.

هەنگاوی دووەم: تەکفیرکردنی طاغوتپەرستەکان.

هەنگاوی سێیەم: تەکفیرکردنی ئەو طاغوتپەرستانەی کە دەڵێن (ئێمە موسوڵمانین!). لەخوارەوە قسە لەسەر ئەم هەنگاوانە ئەکەم و دەلیلەکان لەبارەیەوە باس ئەکەم.

هەنگاوی یەکەم: تەکفیرکردنی طاغوتەکە:

واتە پێویستە خودی طاغوتەکە تەکفیر بکرێت، لە بەشی پێشتردا ئاماژەمان بەو طاغوتانە کرد کە ألله لە کتێبەکەیدا باسی کردوون، جا یەکەم هەنگاوی (کوفر بە طاغوت) ئەوەیە کەوا موەحیدەکە کوفر دەکات بەو طاغوتانەی کە باسکران. بەڵگەش لەسەر ئەم هەنگاوە بریتیە لە فەرمایشتی ألله: ﴿...فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ...﴾ البقرة: ٢٥. واتە: {جا هەر کەسێک کوفر بکات بە طاغوت و باوەڕ بهێنێت بە ألله ئەوا بەدڵنیاییەوە دەستی گرتووە بە هۆکارێکی پتەو}. زۆر ئاشکرایە کە لەم ئایەتەدا ألله فەرمانمان پێدەکات طاغوتەکان تەکفیر بکەین.

هەنگاوی دووەم: دەبێ (طاغوتپەرستەکان)ـیش تەکفیر بکرێن:

مەبەست لە طاغوتپەرست ئەو کەسەیە کە نەک هەر کوفری بە طاغوت نەکردووە، بەڵکو باوەڕی بە یەکێک لەو طاغوتانە هەیە کە ألله لە قورئاندا باسی کردوووە و باسمانکرد پێشتر. طاغوتپەرستەکانیش کەسانێکن کە باوەڕیان بە یەکێک لەو طاغوتانە هەیە کە لە بەشی پێشوودا باسمان کرد. هەر کەسێک بۆ نموونە باوەڕی بە دیموکڕاسیەت هەبێت (وەکو حیزبی پارتی و یەکێتی)، یان باوەڕی وابێت جادووگەرەکان قسەکانیان ڕاستە، یان باوەڕی وابێت کەوا کەسانێک شایەنی پەرستنن لە غەیری ألله (وەکو سۆفیەکان)، ئەوا ئەو کەسانە طاغوتپەرستن و کوفریان بە طاغوت نەکردووە و فەرمانی پەروەردگاریان جێبەجێ نەکردووە. بۆیەش ئەو کەسانە دەبێ تەکفیر بکرێن؛ چونکە کافرن. بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا﴾ النساء:٥١. واتە: (ئەی محمد، مەگەر ئەو کەسانەت نەدیوە کە بەشێک لە کتێبی تەوراتیان پێ گەیشتووە و لە هەمان کاتیشدا باوەڕیان بە پەیکەر و طاغوت هەیە؟! هەروەها بە موشریک و کافرانیش دەڵێن کەوا ئەوان

(واتە موشریک و گاورەکان) ڕێبازەکەیان باشترە لە ڕێبازی ئیمانداران). لەم ئایەتەدا ألله نموونە بە جولەکەکان ئەهێنێتەوە کە سەرەڕای ئەوەی تەوراتیان لەلا بوو، کەچی باوەڕیان بە (پەیکەر) و (طاغوت) هەبوو، حەتمەن ئەو کەسانە کافرن و نەفرەتیان لێکراوە، هەروەک ألله لە ئایەتی دواتردا فەرمووی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا﴾ النساء: ٥٢. کەوابێت هەر چ کەسێک باوەڕی بە (طاغوت) هەبێت ئەوا کافرە و نەفرەتی لێکراوە. بۆیەش پێویستە ئەهلی تەوحید ئەو کەسانە تەکفیر بکەن؛ چونکە ئەمانە پێیان دەگووترێ (طاغوتپەرستەکان)، مەدخەلیەکان (واتە بەناو سەلەفییەکان) لەم هەنگاوەدا دۆڕاون؛ چونکە بەلای ئەوانەوە بە شەریعەتی دیموکڕاسیەتی طاغوتیش هەبێت ئەوا هەر موسوڵمانیت! ئەگەر سوجدە بۆ غەیری ألله ببەیت ئەوا هەر موسوڵمانیت مادام دەڵێی (لا إله إلا الله!)، هەر بۆیەش مەدخەلیەکان مەرجی یەکەمی تەوحیدیان تێدا نییە ئەویش (کوفر کردنە بە طاغوتە)، چونکە ئەوان ألله بە درۆ ئەخەنەوە -پەنا بە ألله- ئەوەتا ألله لە قورئاندا پێمان دەڵێت هەر کەسێک باوەڕی بە طاغوت هەبێ ئەوا کافرە، کەچی مەدخەلیەکان دەڵێن (نەخێر موسوڵمانە چونکە نوێژ دەکات).
هەنگاوی سێیەم: تەکفیرکردنی ئەو طاغوتپەرستانەی کە دەڵێن ئێمە موسڵمانین: ئەمە هەنگاوێکی زۆر گرینگە و زۆرێک لە خەڵک لەم هەنگاوەدا دۆڕاون؛ چونکە دەترسن لەوەی کەسانێک تەکفیر بکەن کە خۆیان وەکو موسوڵمان پیشانداوە لەکاتێکدا باوەڕیان بە طاغوتیش هەیە!! بۆ نموونە زۆربەی خەڵک ناوێرێ بڵێت (عەلی باپیر) کافرە! تەنها لەبەر ئەوەی عەلی باپیر وەکو کەسایەتیەکی دیندار خۆی پیشانداوە! بەڵام لەڕاستیدا کافرە؛ چونکە باوەڕی تەواوی بە شەریعەتی دیموکڕاسیەتی طاغوتی هەیە، هەروەها موماڕەسەشی دەکات و ئەوەتا خاوەنی حیزبیشن، کەواتە دەپرسم: کوانێ تەوحیدی ئەم پیاوە؟ کوانێ کوفر بە طاغوتەکەی؟ هەر کەسێک کە خۆی بە دیندار و زانا پیشان بدات کەچی

باوەڕی بە جۆرێک لە جۆرەکانی طاغوت هەبێت کە لە بەشی پێنجەمدا باسکران، ئەوا ئەو کەسە موسوڵمان نییە و تەوحیدی تێدا نییە و کوفری بە طاغوت نەکردووە. بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله کە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ النساء: ٦٠. واتە: (ئەی محمد، مەگەر ئەو کەسانەت نەدیوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە باوەڕیان بەو کتێبەیە کەوا بۆتۆ دابەزیوە هەروەها باوەڕیان بەو کتێبانەشە کە لە پێشی تۆ دابەزیون، کەچی لە هەمان کاتیشدا ئەیانەوێت حوکم بۆ طاغوت بگەڕێننەوە لەکاتێکدا بەدڵنیاییەوە فەرمانیان پێکراوە تاکو کوفری پێبکەن. شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور). بۆیەش ئەی خوێنەری بەڕێز، ئەوەتا دەلیلیشت بینی، بزانە هەنگاوی سێیەمی (کوفرکردن بە طاغوت) ئەوەیە کە تەکفیری ئەمجۆرە کەسانە بکەیت کە خۆیان وا پیشاندەدەن ئەهلی تەوحیدن و ئەهلی ئیسلامن، کەچی باوەڕیان بە طاغوت هەیە! جا هەر کەسێکیش ئامادە نەبێت تەکفیریان بکات ئەوا ئەویش کافرە؛ چونکە ألله بەدرۆ ئەخاتەوە لەکاتێکدا ألله تەکفیری کردووە.

## بەشی حەوتەم

باوەڕهێنان و تەوحید کردنی ألله لەڕووی (ربوبیة):

لە بەشی (چوارەم) و (پێنجەم) و (شەشەم) هەڵساین بە باسکردنی مەرجی یەکەمی تەوحید، ئەویش بریتی بوو لە (کوفر کردن بە طاغوت ئێتر لەم بەشەوە تاکو کۆتایی باس لە مەرجی دووەمی تەوحید ئەکەین ئەویش بریتییە لە (باوەڕهێنان بە ألله) حەتمەن باوەڕهێنان بە ألله واتە

دەبی تەوحیدی ألله بکەین لە سێ ڕووەوە:
١- توحيد الربوبية
٢- توحيد الألوهية
٣- توحيد الأسماء والصفات
توحيد الربوبية: واتە تەوحید کردنی ألله لە کارە تایبەتییەکانی خۆی ، بۆ نموونە: دەبێ باوەڕمان وابێت تەنها ألله دروستکەرە و باشترین دروستکەریشە (واتە خلق). هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت تەنها ألله ڕۆزیمان پێ دەدات و سەرچاوەی هەموو ڕۆزیەکانیش هەر لەلای ألله یە (واتە رزق) هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت کاروباری ئەم گەردوونە بەتەنها لەلایەن ألله بەڕێوەدەچێت هیچ هاوبەشێکی لەگەڵ نییە (واتە إدارة) هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت کە دانانی شەریعەت و یاساکان تەنها مافی ألله یە و نابێ هیچ مرۆڤێک لە غەیری ألله یاسا و شەریعەت دابڕێژێت (واتە حاكمية). هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت تێکڕای ئەم گەردوونە هەمووی موڵکی ألله یە و هیچ کەسێک لەگەڵیدا هاوبەش نییە (واتە ملك). هەریەک لەم خاڵانەش کۆمەڵێک دەلیلیان لەبارەوە هاتووە لە قورئان، لەخوارەوە بە کورتیی ئاماژەی پێدەکەم:
دەلیل لەسەر (خلق) | سوڕەتی المؤمنون، ئایەتی ١٤.
دەلیل لەسەر (رزق) | سوڕەتی الملك، ئایەتی ٢١.
دەلیل لەسەر (إدارة) | سوڕەتی یونس، ئایەتی ٣.
دەلیل لەسەر (حاكمية) | سوڕەتی یوسف، ئایەتی ٤٠.
دەلیل لەسەر (ملك) | سوڕەتی الملك، ئایەتی ١.
نموونەی تریش زۆرن لەو کارانەی کە ألله لە قورئاندا باسی کردوون و تەنها کاری ئەون و دەبێ ألله بە پێشەنگ دابنرێت لەو کارانە، نابێ باوەڕمان وابێت کەوا کەسێک هاوبەشە لەگەڵ ألله لەم کارانە. هەر چ کەسێک باوەڕی وابێت کەوا کەسێک هەیە و دەتوانێت بوونەوەرەکان دروست بکات، یان دەتوانێت یاسا و شەریعەت دابنێت، یان موڵکی ئەم

گەردوونەی لەژێر دەستە و ...هتد. ئەوا ئەو کەسە تەوحیدی تێدا نییە و موشریکە نەک موسوڵمان؛ چونکە ئەم کارانە تەنها مافی ألله یە.

## بەشی هەشتەم

باوەڕهێنان و تەوحید کردنی ألله لەڕووی (ألوهیة) :
توحید الألوهیة: بریتییە لە تەنها کردنی ألله لە هەموو پەرستنێکمان.
بۆیەش هەندێک لە زانایان پێی دەڵێن (توحید العبادة). واتە ئەگەر هەر پەرستن و عیبادەتێکمان ئەنجامدا ئەوا دەبێ تەنها و تەنها بۆ ألله بیکەین، نابێ هیچ مرۆڤێک یان گۆڕێک یان پیاوچاکێک یان پێغەمبەرێک یان دارێک بکەین بە هاوبەشی ألله لەکاتی پەرستنەکانمان، خۆ ئەگەر هەر کەسێک پەرستنێک بۆ غەیری ألله بکات ئەوا شیرکی گەورەی کردووە و ئیتر لە چوارچێوەی ئیسلام نامێنێت و موشریکە،حەتمەن پەرستنیش بە چوار جۆر ئەنجام دەدرێت و پێویستە بە هەر چوار جۆرەکەوە تەنها مەبەستمان ألله بێت، کە ئەمانەن:
یەکەم: پەرستن بە (دڵ) : حەتمەن پەرستنی دڵ بریتییە لە (نیەت)، جا پێویستە ئەم نیەتەی لەنێو دڵماندایە بەجۆرێک پەروەردەی بکەین کە ئیتر ئەگەر بمانەوێت هەر قسە و کارێک بکەین ئەوا نیەتەکەمان تەنها ألله بێت، واتە دەبێ ئیخلاس لەنێو دڵمان بچێنین. کاری (دڵ) هێندە گرینگە بۆ موسوڵمان، بەجۆرێک کە موسوڵمانەکە دەتوانێت سوود لە نیەتی دڵی ببینێت و ئیتر لە هەموو کارێکدا خێری بۆ بنووسرێت، بۆ نموونە (نووستن) کارێکی ئاساییە، بەڵام ئەگەر موسوڵمانێک لە پێش نووستنیدا نیەتی وابێت کە خۆی بەهێز بکات تاکو بتوانێت دواتر عیبادەتی زۆرتر بکات، ئەوا تەنانەت نووستنەکەشی بۆی دەبێتە خێر.
دووەم: پەرستن بە (دەم) : نموونەی پەرستنەکانی دەم وەکو زیکر و سەڵەوات و خوێندنی قورئان و دوعا و پاڕانەوە و پێویستە تێکڕای ئەم

پەرستنانە بۆ (ألله) بکرێن نابێ لەپێناوی هیچ کەسێکی تر بانگەوازکردن بکرێ ...هتد.
سێیەم: پەرستن بە (جەستە و کردار) : نموونەی پەرستنە کردارییەکان وەکو نوێژ و ڕۆژوو و قوربانیکردن و جیهاد و حەج و ..هتد، پێویستە ئەم پەرستنانە بە تەنها بۆ (ألله) بکرێن. نابێ ئەم پەرستنانە بۆ هیچ کەسێک بکرێت لە غەیری ألله.
چوارەم: پەرستن بە (ماڵ) : نموونەی پەرستنەکانی ماڵ، وەکو سەدەقە و زەکات. دەبێ نیەتمان لەو پەرستنانەش تەنها ڕەزامەندیی ألله بێت، ڕاستە کەوا تۆ ئەم پارەیە دەدەیتە مرۆڤێک، بەڵام دەبێ نیەتت ئەوە بێت کەوا تۆ ئەم پەرستنە بۆ (ألله) دەکەیت نەک بۆ ڕەزامەندیی مرۆڤەکە.ئاگاداربە خوێنەری بەڕێز، واجبە لەسەرت کەوا بە هەر چوار جۆرەکەی پەرستنەوە تەنها نیەتت (ألله) بێت، نابێ هیچ کەسێک یان شتێک بکرێتە هاوبەشی ألله لە پەرستنەکان. هەر کەسێک پەرستن بۆ غەیری ألله بکات ئەوا موشریکە. ألله لە وەسفی کافرانی قورەیش فەرموویەتی: ﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ﴾ الزمر :٣.واتە:(مەگەر دینداری کردنێکی دڵسۆزانە تەنها شایەنی ألله نییە؟ جا ئەو کەسانەی کە لە غەیری ألله ڕوویانکردووەتە کۆمەڵێک پەیکەر ئەوا دەڵێن: ئێمە ئەوانە ناپەرستین و تەنها دەمانەوێت لە ألله نزیکمان بکەنەوە، بەڕاستیی ألله حوکم لەنێوانیان دەدات لەو بابەتانەی کە تێیدا جیاواز بوون، بەڕاستی ألله ڕێنموویی کەسێک ناکات کەوا درۆزنێکی کافرە).
خوێنەری بەڕێز، ئەوەتا ألله ئەو کەسانەی بە (درۆزن) و (کافر) ناوبرد؛ چونکە پەرستنیان بۆ غەیری ألله ئەنجامدەدا سەرەڕای ئەوەی دەیانزانی ألله بوونی هەیە، کەواتە ئەو کەسانەی لەم سەردەمەدا پەرستن بۆ (گۆڕ)

و (ئیمام علي) و (عبدالقادری گەیلانی) دەکەن ئەوا هەموویان موشریکن؛ چونکە دوعا و پاڕانەوە تەنها دەبێ لە ألله بکرێت، هەر چ کەسێک لە غەیری ألله بپاڕێتەوە یان ئاژەڵ بۆ غەیری ألله سەربڕێت ئەوا موشریکە و تەوحیدی تێدا نییە.

## بەشی نۆیەم

سێ مەرجەکەی پەرستنی ألله (حب وخوف ورجاء) :-
لە بەشی پێشوودا زۆر بەکورتیی باسی (توحيد الألوهية) مان کرد، گووتمان دەبێ هەموو پەرستنەکان بۆ ألله ئەنجام بدرێن بە هەموو جۆرەکانیانەوە، لەم بەشەدا باسی سێ ڕوکنەکەی پەرستن دەکەین، پێویستە لە هەموو پەرستنێکدا موسوڵمان بەم سێ ڕوکنەوە پەرستنەکانی بکات:
١- پەرستنەکان بە ترسەوە بکات (الخوف): بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾ الإسراء: ٥٧.واتە: (ئەوانەی کە -ئەم موشریکانە- لێیان دەپاڕێنەوە، ئەوانە خۆیشیان دەیانەوێت زۆرتر لە ألله نزیک ببنەوە. هەروەها ئومێدیان بە بەڕاستی ڕەحمەتی ئەو پەروەردگارەیە و هەروەها لە سزاکەی ئەترسن سزای پەروەردگارت سزایەکی مەترسی لێکراوە).مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە کە ئەو موشریکانەی کەوا (عیسا) و (عوزێر) و (فریشتەکان) دەپەرستن ئەوا با بزانن کەوا ئەم دوو پێغەمبەرە و تێکڕای فریشتەکانیش خۆیان هەمیشە لە هەوڵی ئەوەن کە زۆرتر لە ألله نزیک ببنەوە! هەروەها ئەوانە هەمیشە ئومێدەوارن بە ڕەحمەتی ألله، هەروەها زۆریش ئەترسن لە سزای ألله.

٢-واجبێتی پەرستنەکان بە ئومێدی قەبوڵ بوونەوە بکات (الرجاء):
بەڵگەش لەسەر ئومێد بوون بە ألله لەکاتی پەرستنەکان زۆرن، هەر ئایەتەکەی خاڵی پێشوو ئەبێتە بەڵگە لەسەر ئومێدەوار بوون بە ألله.
٣- فەرمایشتی پەرستنەکان بە خۆشەویستییەوە بکات (الحب) : بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبّ اللَّهِۗ﴾ البقرة: ١٦٥.واتە: (لەناو خەڵکیدا کەسانێک هەن کەوا پەرستراوی تر دەپەرستن لە غەیری ألله، هەروەها خۆشیان دەوێن وەکو خۆشەویستیی ألله، بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێناوە زۆرتر خۆشەویستییان هەیە بۆ ألله). ئەمانەی باسم کردن بریتین لەو سێ مەرجەی کە پێویستە لەکاتی پەرستنەکانماندا بەرامبەر بە ألله ئەم مەرجانەمان تێدا هەبێت لێرەدا دەبێ ئەوەش بزانین کە کەسانێکی چەواشەکار هەن و ئەڵێن: ‘‘ پێویست ناکات لە ألله بترسین، بەڵکو پەرستنەکانمان تەنها لەبەر خۆشەویستیی ألله ئەکەین نەک لەبەر ئەوەی لێی بترسین !!’’ پەنا بە ألله، من نازانم ئەم کەسانە چۆن ئەوێرن قسەی وابکەن، مەگەر لە (سورەتی الإسراء، ئایەتی ٥٧) ألله پێمانی ڕانەگەیاندووە کەوا تێکڕای پێغەمبەر و فریشتەکان ترسیان لە ألله هەیە؟! ئیتر تۆ یەک کە نە پێغەمبەریت و نە فریشتەی، چۆن ترست لە ألله نییە؟ ئەی خوێنەری بەڕێز: حەقیقەت ئەوەیە کە پێویستە لە تێکڕای پەرستنەکانماندا هەر سێ تایبەتمەندی (حب) و (خوف) و (رجاء) مان تێدا بێت.

## بەشی دەیەم

باوەڕهێنان و تەوحید کردنی ألله لە ڕووی (أسماء والصفات):-

توحيد الأسماء والصفات: بریتییە لە تەوحید کردنی ألله لە ڕووی ئەو ناو و سیفاتانەی کە لە قورئاندا وەسفی خۆی پێ کردووە. دەبێت بە جۆرێک لەم ناو و سیفاتانە تێبگەین کە ألله تیایاندا پێشەنگە و هیچ کەسێک هاوشێوەی ألله نییە لەم ناو و سیفاتانەدا. حەتمەن ئەم تەوحیدەش بەشێکە لە (توحيد الربوبية)، بەڵام زانایان بە تەوحیدێکی سەربەخۆ باسی ئەکەن؛ چونکە زۆر فراوانە و قسەی زۆر هەڵئەگرێت. خوێنەری بەڕێز، بزانە کەوا کۆمەڵە گومڕاکەرەکان هەڵساون بە قەبوڵ نەکردنی ناو و سیفەتەکانی ألله بە چوار شێواز :

١- تعطيل: واتە ڕەتکردنەوەی ناوێک یان سیفەتێکی ألله ! (پەنا بە ألله) بۆ نموونە ئەو کەسانەی کە دەڵێن: ‘‘ (ألله دەستی نییە!)’’ لەکاتێکدا ألله لە قورئاندا لە (سورەتی الفتح، ئایەتی ١٠) ئاماژە بە دەستی خۆی ئەکات. نەک هەر تەنها دەست، بەڵکو چەندین ناو و سیفەتی تریشیان لە ألله سەندووەتەوە لەکاتێکدا ألله بە ئاشکرا باسی کردوون. کەواتە هەر کاتێک ألله لە کتێبەکەیدا باسی هەر ناو و سیفەتێکی خۆی کرد، پێویستە بەبێ هیچ ڕەتکردنەوەیەک قەبوڵی بکەین.

٢- تكييف: واتە بە عەقڵی خۆمان بڵێین سیفەت و ناوەکانی ألله ئاوان و ئاوان. بۆ نموونە ئەگەر کەسێک بڵێت (بەرزیی ألله ئەوەندەیە...) یان (ألله بەمجۆرە و بەمجۆرە لەسەر کورسیەکەیەتی). هەر چ کەسێک ئاوا بە عەقڵی خۆی بیر لە سیفاتەکانی ألله بکاتەوە ئەوا پێی کافر ئەبێت؛ چونکە قسەی لەسەر غەیبیاتی ألله کردووە. نابێت هیچ چۆنیەتییەک بۆ سیفاتەکانی ألله دیاری بکەین و قسەی لەسەر بکەین، بەڵکو هەرچۆنێک لە قورئانەکەیدا هاتبێ ئەوا پێویستە وەک خۆی باوەڕی پێ بهێنین.

٣- تحريف: واتە شێواندنی ناوێک یان سیفەتێکی ألله. زۆرجار ألله لە

قورئاندا باسی سیفەتێکی خۆی ئەکات، کەچی کەسانێک ئەڵێن (نەخێر، ألله مەبەستێکی تری هەیە لەم قسانەی) ،بۆ نموونە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەدا هیچ گومانمان لەوە نییە کە ألله لەسەر عەرشەکەی خۆیەتی، ئەمەش بە دەلیلی (سورەتی طه، ئایەتی ٥) کە تێیدا وای فەرمووە، کەچی کەسانێک ئەڵێن (نەخێر خودا لە هەموو شوێنێک هەیە!)، کەواتە ئایەت و سیفەتی ألله تەحریف کرا لەم حاڵەتە. بەلای زانایانەوە ألله بە زانستەکەی ئاگاداری هەموو شتێک و شوێنێکە، بەڵام خۆی لەسەر عەرشەکەیەتی، ئەمە ڕووکەشی ئایەتەکەی قورئانە و ئێمەش بۆمان نییە بیشێوێنین. جا خوێنەری بەڕێز، یەکێک لەو هێڵە سوورانەی کە بەزێندراوە، ئەوەیە کە بەمجۆرە ناو سیفەتەکانی ألله ئەشێوێندرێت، ئەمەش بەزۆریی لەلایەن سۆفیەکانەوە بینراوە.

٤- تمثیل: واتە لێکچوواندنی ناو و سیفاتەکانی ألله بە یەکێک لە دروستکراوەکانی !! بۆ نموونە ئەگەر کەسێک بڵێت (دەستەکانی ألله وەکو دەستی مرۆڤن و لە گۆشت و ئێسک پێکهاتوون !) ئەمە لێرەدا کوفری کرد؛ چونکە سیفەتێکی ألله بە سیفەتێکی مرۆڤ ئەچووێنێت.

خوێنەری ئازیز، بزانە ألله لە (سورەتی الفتح، ئایەتی ١٠) ئاماژەی بەوە کردووە کەوا هیچ شتێک هاوشێوەی ألله نییە. *حەتمەن بابەتی (أسماء والصفات) زۆر فراوانە، بەڵام لێرەدا پێویستە بڵێم: دەبێ باوەڕمان وابێت کە ألله (تاک و تەنهایە) لە ناو و سیفاتەکانی، هیچ هاوبەشێکی نییە، هەروەها (پێشەنگە) لە تێکڕای ئەو سیفاتانەی کە بۆخۆی باسی کردوون؛ ئەمەش چونکە بەشێک لە سیفەتەکانی ألله لە مرۆڤیش هەیە، بەڵام لای مرۆڤ سنووردارە و کۆتایی پێدێت، کەچی لای ألله بێسنوورە و کۆتایی پێ نایەت بۆ نموونە ألله زاتێکی بەبەزەییە (الرحمن)، مرۆڤیش خاوەنی بەزەییە، بەڵام ئایا بەزەییەکەیان وەکو یەکە؟ نەخێر. هەروەها ألله زاتێکی زیندووە (الحي)، مرۆڤیش زیندووە، بەڵام مرۆڤ وەکو ألله ئەتوانێت نەمر بێت؟ بێ گومان نەخێر. هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت کەوا

سیفاتەکانی ألله هیچیان دروستکراو (مخلوق) نین، بەڵکو تایبەتمەندییەکی خودی ئەون (صفة). لەم باسەشدا کەسانێک ئەڵێن (قسەکان و سیفاتەکانی ألله بریتین لە دروستکراوی خۆی !)، ئەم بیروباوەڕە کوفرە بە ئیجماعی زانایان لە سەلەفەوە تا ئێستا. بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەم هەڵەیەش، زانایان چەندین کتێبیان نووسیوە و خەڵکیان لە حەقیقەتی باسەکە ئاگادار کردووەتەوە.

خوێنەری ئازیز، تاکە سەرچاوەیەک کە لەڕێگایەوە ئەتوانین بزانین ناو و سیفاتەکانی ألله چۆنن و چین، بریتییە لە کتێبەکەی ألله، بۆیەش نابێ بەهیچ بابەت و کتێب و وتارێک باوەڕ بکەین ئەگەر قسەی لەسەر ناو و سیفاتەکانی ألله کرد بەبێ دەلیل. نابێ گوێ لەو کەسانە بگرین کە بەبێ زانست قسە ئەکەن، هەروەک ألله فەرموویەتی : ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾. الإسراء: ٣٦. واتە: {هەروەها لەسەر شتێک مەوەستە کە زانستت پێی نییە...}

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

رمّضان – ١٤٣٩هیجری

Instagram: Bangauaz ئیستاگرامی بانگەواز